بەشی ـــــ دووەم

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ

باشترینتان ئەو کەسەیە کەخۆی فێری قورئان دەکات وەخەڵکیش فێردەکات



# چۆنیەتی فێربوونی

# قورئان خوێندنەوە



چاپی: ٣

0750 888 9270
ئەستێرە

## بەشی یاساکان



# بسم الله الرحمن الرحيم

وبه نستعين وعليه نتوكل والصلاة والسلام على من بعث رحمة للعالمين وعلى آله وصحبه أجمعين أما بعد.

پشتیوان بەخودا لەم بەشەیاندا:

باسی چەند یاسایەکی گرنگ دەکەین کە پێویستە خوێندکاری کورد بیانزانێت لە کاتی خوێندنەوەی قورئاندا وە زۆر بەشێوەیەکی جیاواز باسی یاساکانی (تجوید) دەکەین هەوڵدەدەین تاکی کورد فێری خوێندنەوەیەکی ڕەوانی خوێندنەوەی قورئانی کەین و ئامانجمان گەیاندنی شێوازی دەربڕینی یاساکانە بۆ تاکی کورد، تاکە مەرجی فێربوون لەگەڵ ئێمە بریتیە لە زانینی زمانی کوردی، وە لەم بەشەدا یاساکان زۆر جیاواز باسکراون و لەڕووی شێوازی شیکردنەوە و ڕیزبەندی بابەتەکان، وە پێویستە خوێنکار پێش ئەم بەشە بەشی یەکەمی بەتەواوی وەرگرتەبێت، چونکە بەشی دووەم بەستراوەتەوە بە بەشی یەکەم، زۆربەی بەشی یەک دووبارە دەبنەوە بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز، ئەمەش بۆ ئاسانکاری خوێنکارە، تا بتوانێ یاساکان هەنگاو بە هەنگاو تێبەگات، داواکارم لە خوای پەروەردگار دامەزراومان بکات لە سەر بیروباوەڕی ڕاست و دروستی ئیسلام تا وەکو مردن و پاشان لە سەری حەشرمان بکات لەگەڵ پێغەمبەران و پیاوچاکان و پیشەوایانی ئوممەت و زانایانی ڕەسەنی ئیسلام.

والحمد لله رب العالمين

ئامادەکردنی :سەلمان عبدالله قادر

٠٧٥٠ ٢٤٢ ٢٥٨٢

( پێداچوونەوەی بەشێک لە پسپۆڕان)

لاواز # - وانەی یەکەم - قەڵەو



# یاساکانی راء



لە زمانی عەربیدا پیتی راء بە دوو شێوە دەخوێندرێتەوە بە (قەڵەو وە یان لاواز ) وە لەزمانی کوردیشدا بە هەمان شێوە یە بەڵام بۆ جیاکردنەوەی راء لە زمانی کوردیدا تەنها بە حەوتەکەی ژێری دەی ناسینەوە کاتێك حەوتەکەی لە ژێربێ ( ڕ )بە قەڵەو دەیخوێندرێتەوە، نمونە (ڕەوەند) وە کاتێک حەوتەکەی لە ژێر نەبێ ( ر )بە لاواز دەیخوێندرێتەوە نموونە(دەرباز) بەڵام لە زمانی عەربیدا بۆ جیاکردنەوەیان چەند یاسایەکمان هەیە:

أ- ناسینەوەی راء لاواز

١- هەرکاتێک پیتی راء ژێرەی(کسر ) هەبێ:

رِ _ رِحْلَةٌ _ ر یحلەتون.

٢) هەرکاتێک پیتی راء زەنەی (سکون) هەبوو، وە پیتی پێش خۆی ژێرەی (کسرـ) هەبوو وە دوای راء کە پیتی بەرزەکان (حرف استعلاء) نەهاتبێ، پیتە بەرزەکان (خ، غ، ق، ط، ظ، ص، ض).

کاتێك دێت لە یەك وشەدا.

ـِ + رْ (پیتە بەرزەکان نەهاتبن)

فِرْدَوْسِ - فیردەوسی

تێبینی:

کاتێك لە دوو وشەدا.

هەرکاتێك پیتی راء زەنەی (سکون) هەبوو وە پیتی پێش خۆی ژێرەی (کسر) وە وشەی دوای کەدێت پیتی یەکەم بە پیتە بەرزەکان (خ، غ، ق، ط، ظ، ص، ض) دەستی پێکردێ هەر بە لاواز دەیخوێنیتەوە.

نمونە:

وَ أَنْذِرْ قَوْمَكَ - وە ئەنذیر قەومەکە

ب-ناسینەوەی راء قەڵەو (راء) بەزانینی دوو یاساکەی(راء)ی لاواز ئەوی تر بە هەر شێوازێك بێت قەڵەوە، بەڵام کاتێك ڕانەوەستین! (ان شاالله باسی ڕاوەستان دەکەین) لە وانەکانی داهاتوو.

ج- چ کاتێك راء بە قەڵەو و لاواز دەخوێندرێتەوە؟

-تەنها لە سێ وشەدا بە هەردوو شێواز دەخوێندرێتەوە:

- فِرْقٍ — ڕاوەستان (فیرِق)، ڕۆشتن (فیرِقین-فیرقین)

- مِصْرَ — ڕاوەستان(میصر-میصرِ)-ڕۆشتن(میصرە)

- قِطْرِـــ ڕاوەستان(قیطر-قیطرِ)-ڕۆشتن(قیطری)

# (ٱلْإِدْغَام) - تێکهەلکێشکردن

- دابەش دەکرێت بەسەر ٣ بەشدا:

أ- ٱلْمُتَمَاثِلِين (هاوشێوە)گرێدەری دوو پیت لە دوو وشەدا.

لەم بەشەدا دەگەڕێینەوە بۆ یاسای (٩) بەشی یەکەم یاسای دوانە(شَدَّ)

(دوانەیی پیت)

دوانە - شد

خوێندنەوەی ٣ بڕگە

ل + ل = لّ

لَّ = لْ + لَ = للە

لِّ = لْ + لِ = للی

لُّ = لْ + لُ = للو

- وَقَد دَّخَلُواْ (دْ+دَ=دده) - كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ (تْ+تَ=تته)

المائيدة [٦١-٦١] - غافر [٢٢-٢٢]

- وَٱذۡكُر رَّبَّكَ (رْ + رَ = رره) - إِذ ذَّهَبَ (ذْ+ذَ=ذذه)

آل عمران [٤١-٤١] - الأنبياء [٨٧-٨٧]

- تَسۡطِع عَّلَيۡهِ (عْ+عَ=ععه) - فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِ(فْ+فِ=ففي)

الكهف [٨٢-٨٢] - الإسراء [٣٣-٣٣]

- يُدۡرِككُّمُ ٱلۡمَوۡتُ (كْ+كُ=ككو) - بَل لَّهُمۡ (لْ+لَ=لله)

النساء(٧٨) - الكهف [٥٨-٥٨]

- يُوَجِّههُّ (هْ+هُ=ههو) - عَصَواْ وَّكَانُواْ (وْ+وَ=ووه)

النحل [٧٦-٧٦] - البقرة [٦١-٦١]

- به مینگه (م – ن)

- لَهُم مَّشَوۡاْ(مْ+مَ=ممه) - لَن نُّؤۡمِنَ (نْ+نُ=ننو)

البقرة [٢٠-٢٠] - البقرة [٥٥-٥٥]

**مینگه چیه: ئەو دەنگەیە کە لە ناخی لووت دەردەچێت.**

تێبینی

لەم وشەیی خوارەوە بە هەردوو شێوازەکە دەخوێندرێتەوە:

مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ (٢٨) هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ (٢٩) (ه+هَ=ههه)

(١) ڕۆشتن (ماليههه لەکە )

(٢) ڕاوەستان ماليە - هەلەکە

## • ب (الأدغام) مُتَجَانِسِين (هاوڕەگەز)

پیش ئــەوەی بچینە سەر ئەم یاسایە لە زمانی کوردیدا ئـەم دەستەواژەیە (چەندتان شارەزان)کاتێک دەیخوێنینەوە بەئاسانی هەست دەکەین، کە پیتی دال ناڵین بۆ؟ چونکە قورسە لەسەر زمان بۆیە پیتی دال نامێنێ وە بەهەمان شێوەش لە زمانی عەربیدا هەمانە بەم شێوەی خوارەوە:

- تتێکەلکێشی دوو پیتی هاورەگەز(ئەو دوو پیتەیە کەلە شوێنی درەچوون یەك بن و لە سیفە تیاندا جیاوازبن)

• (ت + د)

أَثۡقَلَت دَّعَوَا(ت+د=دده) الأعراف [١٨٩-١٨٩]

• (د + ت)

وَقَد تَّبَيَّنَ (د+ت=تته) العنكبوت [٣٨-٣٨]

• (ذ + ظ)

إِذ ظَّلَمۡتُمۡ (ذ+ظ=ظظه) الزخرف [٣٩-٣٩]

• (ث + ذ)

يَلۡهَث ذَّٰلِكَ (ث+ذ=ذذه) الأعراف [١٧٦ -١٧٦]

## أدغام ناقص

أدغام ناقص: واتا بۆ مخرجی پيتی يەكـــەم دەچين و لە مخرجی پيتی دووەم هەڵدەستينەوە.

(ط + ت)

بَسَطتَ (ط+ت=ت)

المائيدة [٢٨ -٢٨]

**تێبینی**

لەم نمونەی خوارەوە پیتی (ب )نامێنێ وە مینگەی دەدەینێ لەکاتی مانەوە لەسەر پیتی (م).

**مینگە چیە:** ئەو دەنگەیە، کە لە ناخی لووت دەردەچێت.

(ب + م)

ٱرۡكَب مَّعَنَا (ب+م=ممە) هود [٤٢ - ٤٢]

## (ج) ٱلْإِدْغَام مُتَقَارِبِين (لێکنزیک)

(تتێکەلکێشی دوو پیتەکە لە شوێنی دەرچوون و سیفەتی لێك نزيك بن)

(ق + ك)

نَخۡلُقكُّم (ق+ك=ككو) المرسلات [٢٠-٢٠]

(ل + ر)

قُل رَّبِّي(ل+ر=ڕڕە) الكهف [٢٢-٢٢]




# وانەی ٣




## حەوت ئەلیفەکان

أ -دەنوسرێ وە ناخوێندرێتەوە بازنەکەی سەری( أ )(زۆر تۆخە وە بازنەییە) لە هەر جێگایێک هات لە قورئان. لە بەشی یەکەم لە لاپەڕەی تێبینەکان باسکراوە.

أ -دەنوسرێ وە دەخێنوێندرێتەوە بازنەکەی سەری( أ ) (کالە وە بازنەکەی تەواو نیە) لە حەوت شوێن دێت لە قورئاندا.

- ئەمانەی لەم وشانەی خوارەوە کاتێک وەستاین لەسەری ئەم( أ ) نیشانەیە بە بزوێنی درێژ دەیخوێنینەوە بەڵام کاتێک نەوەستاین لەسەر وشەکە بە بزوێنی کورت دەیخوێنینەوە.

- أَنَاْ –وەستان(ئەنا)ڕۆشتن(ئەنە) لە هەر جێگایێک هات لە قورئاندا.

- لَكِنَّاْ –وەستان(لاکیننا)ڕۆشتن(لاکیننە) الکهف [٣٨-٣٨].

- ٱلظُّنُونَاْ — وەستان(ئەظظونوونا) ڕۆشتن(ئەظظونوونە) الأحزاب [١٠-١٠]

- ٱلرَّسُولَاْ — وەستان(ئەڕڕسووولا) ڕۆشتن(ئەڕڕسووولە) الأحزاب [٦٦-٦٦] .

- ٱلسَّبِيلَاْ — وەستان(ئەسسەبیلا) ڕۆشتن (ئەسسەبیلە) الأحزاب [٦٧ -٦٧].

- قَوَارِيرَاْ — وەستان(قەوارِیرا) ڕۆشتن(قەوارییرِە) الإنسان [١٥-١٥].

- سَلَٰسِلَاْ — وەستان(سەلاسیلا) ڕۆشتن(سەلاسیلە)، بۆ حەوتەم دانە ئاسایە

بە (سەلاسیل) بخوێننیتەوە لە کاتی وەستاندا، واتا هەردووک شێوەکەی

دروستە الإنسان [٤-٤].






- وانەی چوارەم -

# چۆنیەتی وەستان لەسەر کۆتا پیت

- چۆنیەتی وەستان لەسەر کۆتا پیت لە قورئاندا(سێ جۆرە):

١- گەر کۆتایی پیت بە (ة) یان (ه) بوو دەبێت بە پیتي (ه) کاتێک کە ڕاوەستاین بەڵام بە نوسین شێوەی وەک بزوێنی کورت (ه)دەنوسرێ.

نمونە: رِحْلَةَ - (ریحله)

فِيهِ - (فییه)

٢ - گەر کۆتایی پیت بە (بَا- باً) یان(ىٰ) یان ( ءً)بوو دەبێت بە بزوێنی درێژ.

نمونە: بَنَىٰهَا- (بناها) - أَتْرَابًا (ئەتڕابا)

يَخْشَىٰ- (یەخشا) - ماءً (مائا)

٣-گەر کۆتایی پیت جگە لە مانەی سەرەوە بوو تەنها خودی پیتەکە دەخوێنینەوە. (خودی پیت= سکون)ساکن

نمونە: لَهَبَ- (لەهەب) - نَسْتَعِينُ (نەستەعیین)



## تێبینی

أ- گەر کۆتایی پیت دوانە(شَدَّ)بوو تەنها نیشانەی دووەمی دوانە(شَدَّ) لادەبەی.

نمونە: لَهَبَّ- (لەهەبب).

ب -پێش کۆتا پیت ( يْ )و( وْ ) زەنە ( سکون ) بێت ئەوا پیتی (ی) و (و) کە زەنە ( سکون ) لەسەرە درێژی دەکەینەوە، بەڵام بیرت نەچێ ئەم خاڵەیان جیاوازە لە یاسای ۱۱ و ۱۲ بەشی یەکەم.

نمونە: قَوْلٌ- (قەوول) - قُرَيْشٌ (قورەییش)

- ج - لەسەر راء وەستان:

۱- هەر کاتێک پیتی (راء) لە کۆتایی بوو وە لەپێش پیتی (راء)کە پیتی(يْ) کە سَکُون (زەنە) لەسەربێ بێ ئەوا پیتی (راء) بە لاوازی دەیخوێندرێتەوە.

نمونە: خَيْرٌ- (خەیر)

٢- هەر کاتێک پیتی (راء) لە کۆتایی بوو وە لەپێش پیتی (راء)کە پیتی(ی)درێژ هاتبێ ئەوە پیتی (راء) بە لاوازی دەیخوێندرێتەوە.

نمونە: خَبِيرٌ- (خەبییر)

- (ی) درێژ لە یاسای ١٢ بەشی یەکەم باسمان کردوە.

٣- هەرکاتێک پیتی راء کۆتاپیت بوو وەپێش خۆی پیتەکە زەنە(سکون) لەسەر بوو وە پێش ئەویش پیتەکە ژێرەی (کسر) هەبوو ئەوا بە لاواز دەیخوێندرێتەوە.

نمونە: حِجْرٍ- (حیجر)

# -وانەی پێنجەم -

## مد) درێژکردنەوە )

پێش ئەوەی باسی وانەی پێنج کەین دەبێت بەگەڕانەوە بۆ یاسای ١٠-١١-١٢ بەشی یەکەم  کە چۆن بزوێنی کورت (ە)دەبووە (ا)بزوێنی درێژ وە (و) کورت دەبووە (وو) درێژ وە (ی) کورت دەبووە (یی) درێژ.

- درێژکردنەوە: لە پیتی (و ،ی، ا) رودەدات وە ماوەی درێژکردنەوەکەش لە دوو جوڵە(حرکە) تا شەس جوڵە(حرکە) روودەدات.

# خاڵی ( أ )

أ - چ کاتێک دوو جوڵە(حرکە) پیتی (و ،ی، ا) درێژدەکەینەوە کاتیک

1- لەگەڵ وشەدا.

2- لەگەڵ پیتدا.

### ١- لەگەڵ وشەدا:

- هەرکاتێک پیتێکی زمانی عەرەبی هات بۆرەی(ضمه) هەبوو وە دوای خۆی پیتی (و) هاتوو وە هیچی لەسەری نەبوو ئەوە دوو جوڵە درێژی دەکەینەوە.

نمونە: يَسْجُدُونُ - (یەسجودوونە)

دووجار وتنی پیتی(و)ەکە دەکاتە دوو جوڵە(حرکه).

- هەرکاتێک پیتێکی زمانی عەرەبی هات ژێرەی(کسر) هەبوو وە دوای خۆی پیتی (ی) هاتوو وە هیچی لەسەر نەبوو دوو جوڵە درێژیدەکەینەوە.

نمونە: نَسْتَعِينُ - (نەستەعیینو)

دووجار وتنی پیتی(ی)ەکە دەکاتە دوو جوڵە(حرکه).

- هەرکاتێک پیتێکی زمانی عەرەبی ( بَ ٰ ) یان (بَا)هات بە بزوێنی درێژ دەیخوێنینەوە بەهەمان شێوەی زمانی کوردی خۆمان دوو جوڵە درێژیدەکەینەوە.

نمونە: هَٰمَٰنَ - (هامانە) - هَٰذَا - (هاذا)

## ٢-لەگەڵ پیت دێت.

- مەبەستمان ئەو پیتانەی کە لە سەرەتای قورئاندا دێن کە باسمان کردوون لە وانەی یەکەم بەشی یەکەم ئەو پیتانەی کە دوو جوڵە(حرکە) درێژیان دەکەینەوە کە پێنج پیتن ئەوانیش پیتی: ح(حا) - ی(یا)- ط(طا)-ھ(ھا) -ر(را).

نمونە:

طٰهٰ- (طاھا)

حٰمٓ - (حامیم) - جارێ باسی پیتی ( میم )ناکەن.

یٰسٓ - (یاسین) - جارێ باسی پیتی ( سین )ناکەن.

الٓرٰ -(ئەلیف لام را) - جارێ باسی پیتی ( لام )ناکەین وە پیتی (ئەلیف) بە ئاسای دەیخوێنینەوە وە تەنها پیتی (ئەلیف) وایە وە پیتەکانی سەرەوە بە (حَيٌّ طَهُر) دەخوێندرێتەوە وە ناسراوە لە زانستی تەجویدا، وە ئەم یاسای سەروە دەوترێت(مد طبيعي) واتە درێژکردنەوە سروشتی.

- ( ب ) درێژکردنەوەی ٤ بۆ ٥ جوڵە(حرکە)

١- لە یەك وشەدا هات

٢- لە دوو وشەدا هات

١- لە یەك وشەدا هات:

بزوێنی درێژ+ء=٤-٥ جوڵە

درێژکردنەوەی سروشتی+ ء=٤-٥ جوڵە

نمونە: ٱلسَّمَآءَ - (ئەسسماااائە)

--------

(و) درێژ+ء=٤-٥ جوڵە

درێژکردنەوەی سروشتی+ ء=٤-٥ جوڵە.

نمونە: سُوٓءَ- (سووووئە)

--------

(ی) درێژ+ء=٤-٥ جوڵە

درێژکردنەوەی سروشتی+ ء=٤-٥ جوڵە.

نمونە: سِيٓـَٔتْ- (سیییییئەت)

٢- له دوو وشەدا هات:

بزوێنی درێژ+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه

درێژکردنەوەی سروشتی+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه.

نمونه: مَآ أَنْزَلَ - (مااااا ئەنزەله)

--------

( و ) درێژ+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه

درێژکردنەوەی سروشتی+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه.

نمونه: قُوٓاْ أَنْفُسَكُمْ - (قووووو ئەنفوسەکوم)

--------

( ی ) درێژ+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه

درێژکردنەوەی سروشتی+ أ = ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ جوڵه.

نمونه: بَنِيٓ ءَادَمَ - (بەنیییی ئادەمە)

- ( ج ) درێژکردنەوەی ٦ جوڵە(حرکە)

١- یەك وشەدا    ٢-لەگەڵ پیتدا

١- لە وشەدا دوو بەشە:

- أ - درێژکردنەوەی سروشتی+پیتێک دوانەی( شَدَّ )ی هەبێ= ٦ جوڵە.

- ب - درێژکردنەوەی سروشتی+پیتێک زەنە( سکون )ی هەبێ= ٦ جوڵە.

❖أ - درێژکردنەوەی سروشتی+پیتێک دوانەی( شَدَّ )ی هەبێ= ٦ جوڵە.

بزوێنی درێژ+ پیتێک دوانەی( شَدَّ )ی هەبێ =٦ جوڵە.

درێژکردنەوەی سروشتی+ پیتێک دوانەی( شَدَّ )ی

نمونە: رَآدَّ - (رااااااددە)

-------

( و ) درێژ+ پیتێک دوانەی(شَدَّ)ی هەبێ =٦ جوڵە.

درێژکردنەوەی سروشتی+ پیتێک دوانەی(شَدَّ)ی هەبێ =٦ جوڵە.

نمونە: تَأْمُرُوٓنِّي - (تەئموروووووونیی)

أ - درێژكردنەوەی سروشتی+پیتێک زەنە( سكون )ی هەبێ= ٦ جوڵە.

- یەک نموونەمان هەیە لە قورئاندا کە دووجار دووبارەبۆتەوە ءَآلْئَٰنَ (ئاااااالئانە) سورة یونس (٥١)-(١١).

## ١- لەگەڵ پیتدا:

مەبەستمان ئەو پیتانەی کە لە سەرەتای قورئاندا دێن کە باسمان کردوون لە وانەی یەکەم بەشی یەکەم ئەو پیتانەی کە ٦ جوڵە(حرکە) درێژیان دەکەینەوە کە پێنجمان باسکردن لە وانەی پێشوو کە دوو جوڵە درێژیان دەکەینەوە.

نموونە: الٓمٓ - ( ئەلیف لاااااام میییییییم )

طسٓ - ( طاسیییییییین )

صٓ- ( صااااااد )

كٓهيعٓصٓ- ( کاااااف ها یا عەیییییین صااااااد )

نَ - ( نووووون )

قَ - ( قااااااف )

وه پیتەکانــــی سەرەوە بە ( نَقَصَ عَسَلُكُم ) دەخوێندرێتەوە وە ناسراوە لە زانستی تەجویداوە ئەم یاسای سەروە دەوترێت( مد الازم ).

## تێبینیەکانی وانەی پێنج :

•هەندێک درێژکردنەوەی تر:

١- دوو حرکە(جوڵە):

- ـهِے = هیي

نمونە: بِعِبَادِهِ ، ( بێعیبادی هیی )

- ـهُو= هوو

نمونە: إِنَّهُو - ( ئیننه هوو )

- وە لە عەرەبیدا پێدەوترێت (مد صلة الصُغْرى).

حرف متحرك + ـهِے / ـهُو (متحرِّكة) حرف متحرك

٢- جوار یان پێنج حرکە(جوڵە):

ـهٗ = هوووو-هووووو

نمونە: أَمْرُهُۥ - ( ئەمرِوهووووو )

هِۦ - = هییيي-هییییي

نمونە: طَعَامِهِۦ (طەعامیهییییی)

-وە لە عەرەبیدا پێدەوترێت (مد صلة الكبرى)

حرف متحرك + هِۦ / هٗ لهمزه (ء)

٣- شەش حرکە(جوڵە):

ءآ= آ = ئـــا

نمونە: ءَآلذَّكَرَيْنِ - ( ئااااذذەكەرِەیني )

ءَآللهُ - ( ئااااڵڵاهو )

-وە لە عەرەبیدا پێدەوترێت (مد فرق)=(مد لازم)

• وەستان لەسەر درێژکردنەوە :

کاتێک کە وەستاین لەسەر وشەیەک وە پیتی پێش کۆتایی (و-ی-ا) دەتوانین 2 یان 4 یان 6 جوڵە(حرکە) درێژی کەینەوە بەڵام کاتێک قورئان دەخوێنینەوە دەبێت لە راوەستاندا بە یەک شێواز بڕۆین نابێ لەشوێنێک 2 جوڵە بێ وە لەشوێنێکی تر 4 یان 6 بڕۆین ئەمەش یاسایەکە نابێ لێی لابدرێ وە لە زانستی تەجویدا پێ دەوترێ (مد عارض السكون).

(عارض=سکونی توشهاتوو)

| | |
|---|---|
| نمونە: (ی) نَسْتَعِينُ | نمونە: (و) مُفْلِحُونَ |
| - (نەستەعیین) 2 جوڵە. | - ( موفلیحوون ) 2 جوڵە. |
| - (نەستەعیییین) 4 جوڵە. | - ( موفلیحوووون ) 4 جوڵە. |
| - (نەستەعییییین) 6 جوڵە. | - ( موفلیحووووون ) 6 جوڵە. |

**نمونە: ( بزوێنی درێژ ( ا ) ) نَـاسِ**

- ( نااس ) 2 جوڵە.

- ( نااااس ) 4 جوڵە.

- ( ناااااس) 6 جوڵە.

وە ئەمـــانەی ســـەرەوە باســـی ( مــد عـــارض الســـكون ) وە درێژکردنەویەکـی ترمـان هەیە کە هەمـان درێژکـردنەوەی (مد عارض السكون)، بەڵام ناوی(مـد لـين)ە وە لە پیتـی(ی، و) ڕوودەدات وە کاتێک دێنکە پێش کۆتا پیت زەنە(سـكون) لەسەربێ (یْ-وْ).

نمونە: (و) خَوْفٍ

- ( خەووف ) 2 جوڵە.

- ( خەووووف ) 4 جوڵە.

- ( خەووووووف ) 6 جوڵە.

نمونە: (ی) بَيْتٍ

- ( بەییت ) 2 جوڵە.

- ( بەییییت ) 4 جوڵە.

- ( بەییییییت ) 6 جوڵە.

## تێبینیەکان

١- مّ وە نّ : کاتێک لە ناوەڕاست یان کۆتایی هاتن دوو جوڵە دەمێنینەوە وە مینگەیان دەدینێ.

مّ:- ناوەراست هات:- مُزَّمِّلُ-(موززەممیلو) کۆتایی هات:-عَمَّ-(عەممە).

نّ:- ناوەراست هات:-نموونە -مَلِكِ ٱلنَّاسِ (مەلی کیننناسي)
کۆتایی هات :-نموونە -إِنَّ -(ئیننە).

٢- وەشەی ( ٱللَّهِ ) هەموو کاتێک پیتی یەکەمی بە (ڵ) ناخوێندرێتوە:

أ - کاتێک پیتی لامەکەی ژێرەی(کسر) هەیە.

نمونە: لِلَّهِ - ( لیللاهی )

ب - کاتێک پێش ( ٱللَّهِ ) وشەیەک دێت کە پیتی کۆتایی ژێرەی(کسر) هەیە.

نمونە: بِسمِ ٱللَّهِ - ( بیسمی للاهی )

ج- کاتێک کاتێک پێش ( ٱللَّهُ ) وشەیەک دێت کە پیتی کۆتایی دوو بۆرەی(ضمتین) هەیە.

نمونە: أَحَدٌ ٱللَّهُ - ( ئەحەدونیللا هو )

●تێبینی خالی ج:- دوو بۆرە(ونْ–ضمتین)-دوو ژێرە(ینْ-کسرتین)-دوو سەرە(ه نْ-فتحتین).

پیتی (ن) لە هەر سێ پیتی سەرەوە زەنەیە(سکون) وە کاتێک لە زمانی عەرەبیدا دوو پیتی زەنە(سکون) دێن لە پیتی زەنەی(سکون) یەکەم پیتی (ی) کورت(کسر) زیاد دەکەین کە لە زمانی عەرەبیدا پێدەڵێن(التقاء ساکنین) وە لە زمانی عەرەبیدا هەرگیز دوو پیتی زەنە(سکون) نایەن وە گەر هاتن پیتی زەنەی(سکون) یەکەم پیتی (ی) کورت(کسر) زیاد دەکەین بۆی.

## جەند پسیارێکی گرنگی بیروباوەر:

**پ/١- پێناسەی ئیسلام چییە؟**

**وەڵام/** ملکەچی کردن تەنها بۆ خودا (**الله**)وە دووربوون لە هاوبەش بریاردان بۆی.

**پ/٢- پەرستش چییە؟**

**وەڵام/** هەر کارێک و گفتارێک خودا پێی خۆشە کە بەندە بیکا.
وەک (لەگەل دەوروبەر باش بوون ، نوێژ.....)

**پ/٣- ئیمان چییە؟**

**وەڵام/** لە دل دەچەسپێ وە بەزوبان دەگووتری و لەکردەوە ڕەنگدەداتەوە.

**پ/٤- بۆ قووبولبوونی پەرستش چیمان پێویستە؟**

**وەڵام/** ١- تەنها بۆ خوا بێ.
٢-چۆن ئیسلام داوای کردووە ئاوا ئەنجام بدرێت.

**پ/٥- پێناسەی کورتی خوا(الله) لەئیسلامدا؟**

**وەڵام/**
بێگومان خوا یەکە و هاوبەشی نییە،هیچ شتێک وەک خودا نییە، هیچ شتێک خوای زاڵ و باڵادەست دەستەوستان ناکات،جگە لە خوا هیچ پەرستراوی دیکە نییە کە شایەنی پەرستنبن،خودا (ئەزەلییە)بەبێ سەرەتایە، هەمیشەییە بەبێ کۆتایە، خوا نەدەمرێ نەدەفەوتێ، هیچ شتێک نابێ مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ، گومانەکان پێی ناگەن، عەقڵەکانیش تێی ناگەن، خودا وەک خەڵکی ناچێ،زیندووە و نامرێ، سەرپەرشتیارە و ناخەوێ، بەدیهێنەرە ،بێ ئەوەێ پێویستی بە بەدیهێنراوەکانی بێ، وە ڕۆزیی دەرە،مرێنەرە ، زیندووکەرەوەیە، بەبێ زەحمەت و قورسیی، بێ نیاز لەهەموو کائینات(دروستکراوەکانی)، زانستی هەیە بەوەی بوە و بەوەی دەبێ، بەوەی نەبوە و بەوەشی کەنابێ، گەر ببوایە چۆن دەبوو، بۆ نەبوە و بۆ ناشبێ، کار لەجێ و کارزان و بەتوانایە، ئاگاداری هەموو دەنگێک و هەر زمانێکە، زانایە بەهەموو شاراوەیەک و ئاگاداری بەوەی پێش وتن چێ دەڵێی ،هەر بۆیە هەرگیز هاوشێوە و هاوتا و هاووێنەی نیە.

## پ٦/ پســـیارێک دەربـــارەی هـــاوبەش بڕیـــاردان (شرک) لە بیرووباوەڕی ئیسلامدا

### شرك و جۆرەكانی

شرك لە زمانی كوردی بە مانای هاوەڵ بریاردان دێت

شرك بالله :- واتە ئەنجامدانی جۆرێك لـە جۆرەكـانی پەرسـن بۆ جگە لە خودا .

### جۆرەكانی شرك

١- هاوبەش بڕیاردانی گەورە ( شرك أكبر ) :واتـە ئەنجامـدانی جۆرێـك لـە جۆرەكـانی پەرسـتن بـۆ جگـە لـە خـودا ، وەكـو نوێژكردن و بەرۆژوو بوون و پشـت بەسـتن و دوعـا و قوربـانی كردن بۆ شێخ و جن و فریشتەكان و گۆرو ... و .

٢- هـاوبەش بڕیـاردانی بچـووك ( شرك أصـغر ) : هـەموو ئـەو جۆرە هاوەل بڕیاردانانە دەگرێتەوە جگە لە هـاوەڵ بریـاردانی گەورە ، وە رێگایەكە بۆ هاوەل بریـاردانی گـەورە و هەنـدێ لـە زانایان هاوەل بریاردانی نادیاریشـیان خسـتوتە پـالی وەكـو ( ریا بازی ) یان سوێند خواردن بە جگە لە خودا .

ریابازی چیە ؟
ریابازی : واتە ئەنجامدانی جۆرێك لە جۆرەکانی پەرستن بۆ ڕەزامەندنی مرۆڤەکان لە شوێن خودا وەکو نوێژکردن بۆ ئەوەی خەلك پێت بلێت نوێژخوێنە ، یان قسەکردن دەربارەی دین بۆ ئەوەی خەلك پێت بلێت زاناو قسە زانە بە دین ، یان باس کردنی کارە چاکەکانت لە لای خەلك بۆ ئەوەی بلێن کەسێکی چاکەکارە ........ هتد .
پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموویێت (( إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَيْكُمُ ٱلشِّرْكُ ٱلأصغرُ))، قَالُوا: وَمَا ٱلشِّرْكُ ٱلْأَصْغَرُ يَا رَسُولَ ٱللهِ ؟ قَال: ((ٱلرِّيَاءُ ......))

واتە (( بەراستی مەترسیدارترین شت کە من لێتان یترسم هاوەل بریاردانی بچووکە ، ووتیان ئەی نێردراوی خودا هاوەل بریاردانی بچووك چیە ؟ ئەویش ووتی (ریا)
*دوعای دووربون لە هاوباش بڕیاردان(شرک)

## دوعای پەنا گرتن لە هاوبەش بڕیاڕدان:

(ٱللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ أَنْ أُشْرِكَ بِكَ وَأَنَا أَعْلَمُ، وَأَسْتَغْفِرُكَ لِـمَا لَا أَعْلَمُ)
(خودایە پەنات پێدەگرم کە هاوباشت بۆ بڕیاردەم کە بزانم ، داوای لێخۆشبونت لێدەکەم کە نازانم هاوباشت بۆ بڕیاردەم)

## چۆنێتی خوێندنەوە بە کوردی:

ئەڵلاهوممە ئیننیی ئەعووذو بیکە ئەن ئوشریکە بیکە وەئەنا ئەعلەمو وەئەستەغفیرۆکە لیما لا ئەعلەمو)

* هەر رەخنە و پێشنیارێک

* هەر کەسێک دەیهەوێت ئەم نامیلکەیەی بە PDF
دەست بکەوێت با پێوەندیمان پێوە بکات

* هەر کەسێک ویستی هاوکاریمان بکات لە
چاپکردن و بڵاوکردنەوەیدا

٠٧٥٠ ٢٤٢ ٢٥٨٢





سەردانی چەناڵی
یوتوب بکەن بۆ
بینینی وانەکان





Salman Abdulla Qadir

سەردانی گرووپی
فێربوونی چۆنیەتی
قورئان خوێندنەوە لە
فەیسبووك بکەن



فێربوونی چۆنیەتی قورئان
خوێندنەوە



سەردانی چەناڵی
فێربوونی چۆنیەتی
قورئان خوێندنەوە لە
تەلەگرام بکەن





سەردانی گۆگڵ بکەن بۆ
فێربوونی چۆنیەتی قورئان
خوێندنەوە




چۆنێتی فێربوونی قورئان
خوێندنەوە

